# ناوەڕۆك




فەڕانسە لە ئەوروپای ساڵی ١٧٩٠. فەڕانسە گەورەترین وڵاتی ئەوروپای ئەو کاتە بوو.

## گرنگی شۆڕشی فەڕانسە

شۆڕشی ساڵەکانی ١٧٨٩ تا ١٧٩٩ی فەڕانسە یەکێکە لە ڕووداوە گرینگەکانی مێژوو. ئەم شۆڕشە گۆڕانکاریەکی سەرسوڕهێنەری لە فەڕانسە وەدیهێنا، کە ئەم وڵاتەی گۆڕی بۆ بەهێزترین وڵاتی ئەوروپا. دەرئەنجامی ئەم شۆڕشە بۆ قارەی ئەوروپا یەك چارەگە سەدە خۆشگوزەرانی بوو. ئەم شۆڕشە بووە هۆی گۆڕانکاری لە هێزە سیاسیە نوێیەکانی وەکوو دیموکراسی و ناسیۆنالیسم. زەربەیەك بوو دژ بە پیکەری زۆرداری پاشاکان و ئەربابانی کەلیسا و خانەدانەکان. کاریگەری ئەم شۆڕشە لە دەرەوەی ئەوروپا، لە ئاسیا و سەرانسەری ئەمریکا هەستی پێدەکرا. وڵاتە نوێیەکانی ئەفریقاو ئاسیا هێشتا هەر یەکەو بەجۆرێك ئەم پرۆسەیەیان گرتۆتە بەر کە بە شۆڕشی فەڕانسا دەستپێکرد، وەفاداری بۆ پاشاو ئاغاکان خڕکرانەوە، لەجیاتی ئەوە وەفاداری بۆ دەوڵەت و حکومەتی خەڵك(دیموکراتی) جێگای گرتەوە. زۆربەی وڵاتە نوێیەکانی دونیا زیاتر حکومەتی دیموکراتین. تەقریبەن زۆربەی ئەندامانی ڕێکخراوی نەتەوەیی خۆیان بە وڵاتانی دیموکراتی دەزانن. لەهەر یەکێك لەم وڵاتانە دانیشتوانەکانی خاوەن مافن، بۆ نموونە وەکوو مافی دەنگدان و مافی دادگای دادپەروەرانە و هاوشێوەی ئەمانە، و هەروەها ئەرکیشیان هەیە وەکو دانی ماڵیات و خزمەتی سەربازی.

بیرۆکەی "هاوڵاتی بوون" واتە یەك مرۆڤی سیاسی چالاك کە هەم مافی هەیە هەم ئەرکیشی هەیە، جێگای ڕەعیەت و تەنها گوێڕایەڵبوونی گرتەوە. لە سەروبەندی خودی شۆڕشەکەشدا خەڵکی هەتا دەستەواژەی "هاوڵاتی"یان وەکوو دەستەواژەیەك بەرامبەر یەکتر بەکار دەهێنا. لەجیاتی ئەوەی بڵێن "موسیودوبوا هاوشاریی دوبوا" دەیانگوت "سیتواین

دوبوا هاوڵاتی دوبوا". هەر هاوڵاتیەك، لە گەڵ ملیۆنان خەڵكی هاونیشتیمانەكەی حكومەتێك دروست دەكەن كە خەڵك سەروەرن. هەم دەوڵەت یان حكومەتی خەڵك و هەم هاوڵاتیانیش لە دەستەكەوتەكانی شۆڕشی فەڕانسەن. كەوابوو، گرنگی شۆڕشی فەڕانسە لەو ڕووەوەیە كە بەدیهێنەری هەندێك لە ئەندێشە گرینگەكانی سیاسی جیهانی نوێیە.

## سروشتی شۆڕشی فەڕانسە

شۆڕشی فەڕانسە تەنها یەك ڕوداوو نەبوو، بەڵكو یەك زنجیرە ڕووداوی ئاڵۆز بوو كە ماوەی ١٠ ساڵی خایاند واتە ١٧٨٩ تا ١٧٩٩. لە سەرەتادا زۆر بەنەرمی داوای چاككردنی بارودۆخەكەیان دەكرد. دواتر، كاتێك كە جڵەوی ڕووداوەكان لە دەستی سەركردەكانی شۆڕشەكە دەرچوو، تۆندڕەوانێكی زیاتر دەسەڵاتیان گرتە دەست و گۆڕانكاری گەورەتر ڕوویدا. فەڕانسە گەورەترین وڵاتی ئەوروپا بوو. حكومڕانانی وڵاتانی دیكەش ترسی ئەوەیان لێنیشت كە نەوەكوو پڕیشكی ئەم شۆڕشە وڵاتانی ئەوانیش بگرێتەوە.

زۆری نەخایاند كە بە هۆی ئەم ترسەوە وڵاتان دەستیان خستە ناو بارودۆخی فەڕانسە و ئاگری جەنگیان خۆشتركرد. ئەم جەنگە خۆی لە خۆیدا ترسی دیكەی بەدوادا هات و بووە هۆی هەڵچوونی هەستی خەڵكی ئەوروپا. كەوابوو، شۆڕش زیاتر لە پێشتر ڕێكەی توندڕەوی گرتە بەر. هەتا ساڵی ١٧٩٤ شۆڕشەكە چەند قۆناغێكی تێپەڕاندبوو، و ئەو گۆڕانكاریانەش كە بە هۆی ئەم شۆڕشەوە ڕوویاندا بوو زیاتر لەوە بوو كە خەڵك چاوەڕوانی بوون لە سەرەتاكانی شۆڕشەوە واتە لە ساڵی ١٧٨٩. لە دوای ساڵی ١٧٩٤ گۆڕانكاریەكان ڕووی لە لاواز بوون كرد. دوای ساڵی ١٧٩٩ لە فەڕانسە ناپلیۆن دەسەڵاتی گرتە دەست و بە هۆی ڕێنمایەكانی ئەو، هەندێك لەو گۆڕانكاریانەی پاراست كە بە هۆی شۆڕشی فەڕانسەوە بەدیهاتبوون، هەندێك لە گۆڕانكاریەكانیشی لە گەڵ مەبەستەكانی خۆی گونجاند هەتا هەندێكیانیشی ئاوەژوو كردەوە.

لەبەرئەمە شۆڕشی فەڕانسە تەنها یەك ڕووداو نەبوو بەڵكو ڕووداو گەلێكی زۆر بوون. ئەم شۆڕشە نەیتوانی بگات بە هەندێك گۆڕانكاریش كە لە ساڵی ١٧٨٩ داواكاری بوون، و بووە هۆی گۆڕانكاری زۆر كە پێشبینیان نەكردبوو.

## هۆكارەكانی شۆڕشی فەڕانسە

مێژوونوسان لە مەڕ شۆڕشی فەڕانسە هەزاران كتێبیان نووسیوە. دەیان بیۆگرافی لەبارەی كەسایەتیە بەناوبانگەكانی شۆڕشەكەوە لەبەردەستدایە و سەدان لێكۆڵینەوەی ورد لەبارەی چۆنیەتی كاریگەری ئەم شۆڕشە لەسەر هەریەك لە ناوچەكانی فەڕانسە. هەرچەند مێژوونوسان پەی بە خاڵی زیاتر ببەن ئەوا ئێمە زیاتر لەو خاڵە نزیك دەبینەوە كە لەم شۆڕشە هەموو جۆرە ڕووداوێك كاریگەریان لەسەر یەكتر هەبووە.



کۆشکی پاشایەتی لە ڤێرسای

جەنگەکانی لویی چواردەهەم پادشای فەڕانسە لە کۆتایەکانی سەدەی حەڤدەیەم، لە ڕووی داراییەوە حکومەت موفلیس کرد، کە ئەمە بە درێژایی سەدەی هەژدەیەم خراپتر بوو. نووسینی فیلسوفەکانی وەکوو ڤۆلتێر و دیدرو بە هۆی دانایی و زیرەکیانەوە بوونە ڕێنماکاری خەڵکانی خوێندەوار تا ڕێگای نوێ بگرنە بەر بۆ ڕەخنە گرتن لە حکومەت، نەیاندەوت کە ئەم وەزیرە یان ئەو دەسەڵاتدارە خراپە، بەڵکو دەیانووت کە ئەم نیزامە لە بنەڕتدا پێویستی بە گۆڕانکارییە.

سەرەنجام کاتێك لە سەرەتای ١٧٨٠ کەوگیر گەیشتە بنی قابڵەمە و هیچ پارە و پولێك نەما، هەر ڕخنە گرتن بوو کە لە دار و دیوار بەسەریاندا خراپ بوو. حاڵ و گوزەرانی جوتیاران و خەڵکی بێ لانەو جێگا لە شارەکان بووە هۆی ئەوەی کە خەڵك شۆڕش بکەن، و ئەمەش هاوکات لە گەڵ ڕەخنەی کەسانێك بوو کە خوازیاری گۆڕانکاری بارودۆخەکە بوون، سەبر سەبر گۆڕدرا بۆ یەك شۆڕشی ڕاستەقینە. بەم پێیە شۆڕشەکە هەم هۆکاری کورت خایەنی هەبوو هەم هۆکاری درێژ خایەنی هەبوو(کە سالآنێك بوو لە ئارادا بوون).

## پاشایەتی

بەر لە ساڵی ١٧٨٩ پاشایەتیەکی دۆکماتیسم لە فەڕانسە دەسەڵاتدار بوو. بە شێوەی تیۆری مانای ئەم ووشەیە ئەوە بوو کە کە قسەی پاشا یاسایە و هەموو دەبێ گوێڕایەڵی بن. بەڵام لە ڕووی عەمەلیەوە دامەزراوە کۆمەڵایەتیە دەسەڵاتدارەکانی وەکوو کەلیسا و ئاغاکان زیاتر نفوزیان لە حکومەتدا هەبوو.

هەڵەخەرجی لە جەنگەکان و خۆشگوزەرانی کۆشکی پاشایەتی بۆ پاشاکانی فەڕانسە شتێکی هەمیشەیی

بوو پارە چـــارەســــەری کێشـــەکان بوو. بۆ ئەوەی حکومەتێك بتوانێ هەر کارێك حەزی لێ بێت بیکات دەبێ پارەی هەبێت. دەبوا یە موچـــەی دا با یە بە ســــەرباز و دەســــەڵاتدارەکان. دەبوایە کەرەســــتەی ســــەربازی بۆ هێزی چــەکداری ئامادە بکات. دەبوایە پارێزگاری لە شوێنە گشتەیەکان بکات.




کۆمەڵگای فەڕانسە: دەبینین کە چۆن جوتیارێکی ئاستی سێیەم ڕۆحانی و ئەشرافزادەیەکی ئاستی دوو و سێی لە کۆڵ کردووە.

ئەگەر مەبەســـت ئەوە بێت حکومەتێك دەرامەتێکی جێگیری هەبێت ئیتر نابێت خەرجیەکەی زیاتر بێت لە داهاتەکەی. بۆ ئەوەی ناڕەزایەتی بەدینەیەت دەبێ مـاڵیـات بـە دادپـەروەرانـە دابـەش بکرێت. بـەڵام لـە شانسی بەدیان، دوو پادشا بەر لە شۆڕشەکە هیچ یەك لەم کارانەیان نەکرد. کاری ئەم پاشـایانە ئەوەبوو کە بە هۆی جەنگە یەك لە دوای یەکەکانیان دەســـتیان کرد بە ماڵیاتی زیاتر وەرگرتن لە خەڵك و قەرز وەرگرتن لە وڵاتانی دیکە. تەقریبەن باری ماڵیاتدان کـەوتبووە ئـەســـتۆی جوتیـارەکـان و تـەبـەقـەی مامناوەند( بورژوازی، واتە پزیشـك، پارێزەر، بازرگان و خاوەن کارگەکان) ئەم کۆمەڵە خەڵکە خۆیان بە سوودمەندترین بەشی کۆمەڵگە لە قەڵەم دەدا، چونکە کاریان دەکرد و سـەروەتیان پێکەوە دەنا. نەجیبزادەو ڕوحانیەکان کە هیچ قازانجێکی داراییان نەبوو، لە گەڵ ئەوەشـــدا ماڵیاتیشـــیان نەدەدا. ناڕەزایی خەڵکی کـاتێك ڕووی لـە زیـادبوون کرد کـە لـە جـەنگی فەڕانســەو بەریتانیا، بەو هەمووە خەرجی زۆرەی کە فەڕانسە لەو جەنگە کردی، لە گەڵ ئەوەشدا فەڕانسە کانەدا و هیندستانیشی لە دەستداو کەوتە ژێر دەستی بەریتانیا. پادشـــای نوێ، واتە لویی شـــانزە گەوجتر لەوەبوو بتوانێ ســــەرکردەیەکی خولقێنەر بێت کە فەڕانســە پێویســتی پێ بوو. ژنە نەمســایەکەی واتە مـاری ئـانـتـوانـت بـە هـۆی خـۆش ڕابـواردن و هەڵەخەرجیەوە ببوە ئامانجی ڕەق و کینەی خەڵك.

دواتر فەڕانسە دەرگیری سەربەخۆی ئەمریکا بوو کە خەرجیەکەی زیاتر لەو جەنگەی دیکە بوو و هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەندێشەی نوێ لەبارەی ئازادی ودیموکراسی لە ناو خەڵکی ڕەواجی پەیدا بکات. خوێندەوارانی فەڕانسی زۆر بە موشتاقانەوە گوێبیستی هەواڵەکان بوون و ئەو جۆرە نامیلکانەیان دەخوێندەوە کە موژدەدەری ئەندێشەی نوێ بوون کە حکومەتێك لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە دەتوانێ جێگای حکومەتی پاشایەتی بگرێتەوە. سەربازە فەڕانسیەکان کە لە ئەمریکا بوون هەموو ڕۆژێك لە کاتی پشکنین گوێبیستی ئەم ووتانە دەبوون کە " هەموو مرۆڤەکان یەکسان دروستکراون؛ خوداوەند مافی یەکسانی داوە بە هەموویان.. حکومەتەکان بۆ پارێزگاری و بەجێگەیاندنی ئەم مافانە دروستکراون...هەرکاتێك حکومەت بیهەوێت ئەم ئامانجانە پشتگوێ بخات، مافی خەڵکە کە ئەم حکومەتە بگۆڕێت یان هەڵیوەشێننەوە".

لە ساڵی ١٧٨٦ حکومەتی فەڕانسە نەیتوانی موچەی کارمەند و سەربازەکانی بدات. وەزیری دارایی پێشنیاری کرد کە کۆمەڵەی نەجیزادەکان پێك بهێنێت. ئومێدەوار بوو کە بتوانێ تێیان بگەیەنێت کە ئەوانیش دەبێ بەشێك لە ماڵیات بدەن بە حکومەت. بەڵام ئەنجامەکەی بە پێچەوانەوەبوو، کاتێك کۆمەڵەی نەجیبزادەکان پێکهات ئەوان پاشایان هاندا کۆبونەوەیەك پێك بهێنێت بە ناوی کۆبونەوەی چینەکانی کۆمەڵگە. ئەم کۆمەڵەی یاسادانانە جۆرێك لە پەرلەمان بووکە زیاتر لە ١٥٠ ساڵ بوو کە ئەم کۆبونەوەیە ڕووی نەدابوو. نەجیبزادەکان ئومێداواربوون بە هۆی ئەم کۆبونەوەیەوە بتوانن مەقامی خۆیان بپارێزن. بەڵام خەڵکیش خوازیاری کۆمەڵەی چینەنەکانی کۆمەڵگە بوون. هەندێك لە خەڵکی پێیان وابوو ئەمە دەرفەتێکە تا پەرلەمانێك وەکو ئەوەی بەریتانیەکان بونیاد بنرێت.



ماری ئانتوانت



نەجیم زادە

چینی سێیەم

پیاوانی کەلیسا

ئەوان نیزامی ئینگلیزەکانیان پێ باش بوو، لەبەر ئەوەی ئەم پەرلەمانە، بێجگە لە نەجیبزادەو ڕوحانیەکان ، ڕێگەیان بە خەڵکی ئاساییش دەدا کە کاتێك بڕیارێکی گرنگ دەردەکرا دەنگیان بگات بە گوێی هەموان. کۆمەڵەی چینە گشتیەکان پێك هاتبوو لە سێ گروپ یان سێ چین: جلەوی دوو چینی ئەوەڵ واتە ڕوحانیەکان و خاوەن زەویە گەورەکان لە دەستی خانەدانەکان بوو. نوێنەرانی چینی سێیەم نوێنەری باقی میلەت بوون.

پێرستی شکایەت و موشکیلاتی خەڵکی لە دەفتەرێك دەنوسرانەوە بە ناوی ( گلەیننامە) کە کۆمەڵەی چینە گشتیەکان دەبوایە پێداچونەوەی بۆ بکات.

خەڵکێکی زیاتر خولیای سیاسەت و گوێگرتن بوون بۆ وتارە سیاسیەکان . لە سەرانسەری فەڕانسە، بەتایبەتی پاریس کە شارێکی گەورە و پایتەختیش بوو، جۆرە یانەیەك بەدیهاتن بۆ گفتگۆکردن و چالاکی سیاسی.

## کەوتنی باستیل

لە ١٧٨٩/٥/٥ کۆمەڵەی چینە گشتیەکان لە ڤێرسای کە دەکەوێتە دەرەوەی پاریس، لە ژێر سایەی کۆشکی پاشایەتی پێکهات. نوێنەرانی چینی سێیەم هەر زوو دەرکی ئەوەیان کرد کە خانەدانەکان بە چاوی ژێردەست تەماشای ئەوان دەکەن و پاشا ویستی نەبوو حکومەتێکی هاوشێوەی حکومەتی ئینگلیز

سوێندخواردن لە هۆڵی تێنس لە ڕوانگەی داویدەوە.

دروست بکات. لە ٢٠/ ٦ی هەمانساڵ کە چینی سێەم لە کۆبونەوەدا بوون زانیان کە دەرگایان لە سەر قوفڵ دراوە. ئەوان لەسـەر ئەوە ڕێککەوتن تا هەلاَیەك ساز نەکەن ئەو شـــوێنە بە جێ نەهێڵن. لەوێدا هۆڵێکی تێنسـیان دۆزیەوە بۆ ئەوەی کۆبونەوەی تێدا بکەن. لەوێدا بڕیاریاندا کە ناوی کۆمەڵەکەیان بگۆڕن بۆ " ئەنجومەنی نەتەویی" سـفرەی ئەم مەجلیسـەش کۆنەکەنەوە هەتا فەڕانســە دەبێتە خاوەنی یەك دەستور. (واتە کۆمەڵە یاسایەك کە بۆ هەڵسوڕاندنی حکومەت پێویسـتە) ئەم "سـوێندخواردنەی هۆڵی تێنس" هـەوەڵین هـەنگـاو بوو دژ بـە حکومـەتی فەڕانسە.

لویی شانزدەهەم نەیدەویست شتێك بکات کە مەقام و مەنسـەبی سـنوردار بکرێت. بەڵام پەی بەوە برد کە ئەنجومەنی نەتەوەیی پشتوانیەکی بەرفراوانی هەیە، بۆیە لەم ڕووەوە وا ڕەفتاری دەکرد کە بیروڕایەکانیان پەسەند دەکات. بەڵام لە لایەکی دیکەوە، سەربازەکان بە دەسـتوری ئەو چـواردەورەی پاریسـان گرتبوو. چـاوەڕوانی ڕوداوێکی مەترسـیدار دەکرا، چـونکە زستانی ئەو ساڵەش بێ حساو سەخت بوو لە وەرزی بەهاریش ئازوقەی پێویست نەبوو.

لە گوندەکان جوتیارەکان بەکۆمەڵ هێرشـیان بۆ ماڵە دوور دەسـتەکان دەبرد. لە پاریس کرێکارانی بێکار بە کۆمەڵ ڕژانە شەقامەکان بۆ گوێگرتن لە وتە و وتاری کەسـانێك کە خوازیاری چاکسـازی بوون و سەرکۆنەی حکومەتیان دەکرد بە هۆی ئەو بارودۆخە



پاریس لە سەردەمی شۆڕش

خراپەی هاتبوویە ئاراوە. پەیدا بوونی سەربازەکان لە ناو پاریس نیشانەی ئەوە بوو کە پادشا دەیهەوێ هێز لە دژیان بەکار بهێنێت. لە ١١/ ٧ی هەمان ساڵ لوئی وەزیری دارای خۆی کە پشتیوانی لە چاکسازی دەکرد، لە کار لادا. بەهۆی ئەم لە کارلابردنەی وەزیری دارایی شۆڕشێك لە پاریس دەستیپێکرد. کۆمیتەی ڕێکخراوەی شارۆمەندان بە زۆر ئیدارەی شاریان گرتە دەست وسوپایەکیان پێکهێنا بە ناوی، گاردی نەتەوی، بە فەرماندەیی مارکی دولافایت، قارەمانی شۆڕشی ئەمریکا. لە ١٤/ ٧ خەڵکی پاریس هەوڵیان دا چەك وەدست بهێنن بۆ ئەوەی لەبەرامبەر سەربازەکانی پادشا پارێزگاری لە خۆیان بکەن. دواتر ڕێرەوەی شۆڕشەکەیان برد بەرەو قەڵایەکی کۆن بە ناوی "باستیل" کە شوێنی دەستبەسەرکردنی زیندانیە سیاسیەکان بوو بەڵام لەو کاتەدا تەنها حەوت زیندانی تێدابوو. بەڵام نومادی دەسەلاتی پاشایەتی بوو. ئەم قەڵایە بە هۆی هێرشێکەوە کەوتە بەردەستی کۆمەڵانی خەڵك. دەستبەسەرداگرتنی باستیل لە سوێندەکەی هۆڵی تێنسیش کاریگەرتر بوو، نیشانەی خەبات کردن بوو بەرامبەر دەسەڵاتی ستەمکاری پادشا. لە ١٤/ ٧ واتە ڕۆژی باستیل هەتاوەکو ئەمڕۆش ئەم ڕۆژە پشووی فەرمیە لە فەڕانسە. بەڵام گرنگترین گۆڕانکاری کە لەم سێ ڕۆژەدا ڕووی دا کەوتنی حکومەتی شاری پاریس بوو. ئەمە ئەوەی نیشان دا کە کەسانێك کە خوازیاری چارسەری ڕیشەیی بوون و بەهۆی کۆمەڵانی خەڵکەوە بتوانن دەسەڵات بگرنە دەست.

هاوینی ئەوساڵە گۆڕانکاری هاوشێوە لە شار و لادێکانی دیکەی فەڕانسە ڕوویاندا، گروپی بچوکی ڕێکخراوەیی سوودیان لە ناڕەزایی خەڵکی بێ دەرتان وەردگرت و لە ڕێگەی ئەوانەوە خۆیان دەهاتنە سەردەسەڵات. لە ناوچە گوندنشینەکان جوتیارەکان ماڵی ئاغاکانیان ئاگرتێبەردا و سەرکار و خزمەتکارانی نەجیبزادەکانیان هەڵواسین، ئەم کارانەش بەرەو بێ نەزمی هەنگاوی دەنا.



کەوتنی باستیل ١٧٨٩/٧/١٤




دان وستانی شۆڕشەکە لە قاوەخانە



یانەیەکی ژاکوبن: یەك کۆمیتەی شۆڕشکار

## ئەنجومەنی نەتەویی

مەجلیسی ئەنجومەنی نەتەویی، کە لەسەر داواکاری پاشا بوو نەجیبزادەکان و ڕوحانیەکانیشی تێدابوو، دەستیکرد بە گفتوگۆ کردن لەبارەی دۆزینەوەی ڕێگا چارە بۆ ئەو شۆڕشەی جوتیارەکان بەرپایان کردبوو. لە چواری مانگی هەشت یەکێك لە نەجیبزادەکان، لەدوای نائومێد بوون، هەڵسا و وەکوو شانۆیەك پێشنیاری کرد کە ئامادەیە دەست لە هەموو مافی دەربەگایەتیەکەی هەڵبگرێت. نەجیبزادەکانی دیکە ئەویان کردە سەرمەشقی خۆیان و مەجلسیش هەر ئەو کاتە بڕیاری دا بۆ لێسەندنەوەی هەموو ئەمتیازەکان لە نەجیبزادەکان. مانگێك دواتر ئەم یاسایە لە جاڕنامەی بەناوبانگ جاڕنامەی مافی مرۆڤ و هاوڵاتی پەسەندکرا، ئەم جاڕنامەیە بناغەیەك بوو بۆ دەستوری نوێ.

جاڕنامەی مافی مرۆڤ موژدەی دا بە مرۆڤەکان کە هەمووان لەبەرامبەر یاسادا یەکسانن، ئازادی پەرەستن، ئازادی ڕادەربڕین و ئازادی نووسین. بەڵام ئەگەر ئەم جاڕنامەیە بە وردی بخوێنینەوە دەبینین زیاتر گرنگی بەوشتانە دەدات کە بۆ ئەو چینە کەسانە گرنگن کە وەزعیان باشە، وەکوو ماڵیات، ئازادی و مافی خاوەنداریەتی. بەڵام بۆ کەسە بێ لانەو نەدارەکان کە لە حەوت ئاسمان خاوەن ئەستێرەیەکیش نەبوون هیچی لە هەنبانەدا نەبوو.

بە درێژایی هاوینی ساڵی ١٧٩٠ چاکسازی دیکە لە مەجلیس پەسەند کرا. نزامێکی نوێی حکومەتی ناوچەیی بەرپا بوو. هەروەها مەجلیس هەوڵی ئەوەی دەدا بە هۆی دەستبەسەرداگرتنی موڵکی کەلیسا، کە خاوەنی یەك لە پێنجی هەموو زەویەکانی فەڕانسە بوون، کێشەی پارە چارەسەربکات. ئامانج ئەوەبوو کە زەویەکان بە نرخێکی کەمتر بە جوتیارەکان بفرۆشن

و ئەو هەلایە دامرکێننەوە. ئەم کارە تاڕادەیەك کێشەی دارایی چارەسەرکرد، بەڵام کێشەی ئێستاکەی مەجلیس بەڕێوەبەری کاروباری کەلیسا بوو، کە داهاتەکەی و لە کۆتایشدا سەربەخۆیەکەی لە دەستدابوو. دواتر مەجلیس قانونێکی دیکەی تێپەڕاند، کە بە پێی ئەو یاسایە ڕوحانیەکان مووچەیان پێدەدرێت و هەموو ڕوحانیەکان دەبێ قەول بدەن گوێڕایەڵی حکومەتی نوێ ببن. پاپا یەکسەر ئەم کارەی بە دژایەتی و هێرش کردن بۆ سەر کەلیسا لە قەڵەم دا. دواتر، ڕوحانیەکان ناچار بوون کە یان پارێزگاریکردن لە کەلیسا هەڵبژێرن یان پشتیوانی لە شۆڕش بکەن. زۆربەیان ڕێگای هەوەڵیان گرتە بەر و بە کەلیسا وەفادار مانەوە.

هەتا پاییزی ساڵی ١٧٨٩ وا دەبینرا کە شۆڕشی فەڕانسە بە ئامانجەکانی گەشتبێت. بازاری دەربەگایەتی هەڵگیرابۆوە. حکومەتی پەرلەمانی بونیادنرابوو. تەنها مابوویەوە نوسینەوەی دەستورێك. چەند ئەندامێکی پەرلەمان دەیانویست کە پادشا نفوزی زۆری هەبێت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ. زۆرینە دەیانویست کە پاشا تەنها یەك مافی ڤیتۆی هەبێت، مەجلیس هەڵوەشێنێتەوە و بریار لە سەر هەڵبژاردنی نوێ بدات. خواستی کۆمارییەکان توندتر بوو. ئەمان دەیانویست بە تەواوی ڕیشەی پاشایەتی هەڵکەنن. چەند ئەندامێکی کۆمارییەکان لە پەرلەماندا هەبوون بەڵام لە یانە سیاسیەکان هێزی پشتیوانی زۆرتریان هەبوو، و خودی ئەم یانانە لە ناو خەڵکی پاریس و باقی شارە گەورەکانی دیکەش نفوزی زۆریان هەبوو.




بنەماڵەی پاشا لە ژێر چاودێرییەکی توند دەگەڕێندرێنەوە بۆ پاریس.



مارا(وێنەی سەرەوە) و دانتۆن (وێنەی خوارەوە) دوو لە سەرانی ژاکوبن کە بە هۆی وتارەکانیان خەڵیکان هاندەدا لە دژی حکومەتی پاشایەتی.



## یانەی ژاکوبنەکان

بەهێزترینی یانەکان، یانەی ژاکوبن بوو. بەڕێوەبەرانی ئەم یانەیە هەستیان بەوە کردبوو کە شۆرشەکەی مانگی حەوت پادشای مجبور کردبوو و پەرلەمانیشی ناچار کردبوو کە بێنە ژێر داواکاریکانی خەڵکەوە، لەوکاتە بەدواوە ژاکوبنەکان کارامەییان هەبوو لە هاندانی خەڵکی ئاسایی بۆ ئەوەی ڕێڕەوی شۆڕشەکە بەرەو ئاراستەیەکی نوێ ڕێبەرایەتی بکەن. لە مانگی نۆ لە پەرلەمان دەمەقرێ و گفتگۆ بوو لەسەرئەوەی کە پادشا ماڤی ڤێتۆی پێبدرێ یان نا. لوئی، پادشای فەرانسە بە شێوەیەکی نەفامانە هەوڵی دا بە ناردنی سەرباز بۆ سەر ڤێرسای بۆ ئەوەی نوێنەرەکان چاوترسێن بکات. یانەکانی پاریس کاردانەوەیان هەبوو بە هاندانی خەڵکی ئاسایی. ئەم کارەش تا ڕادەیەك ئاڵۆزی خستە ناو گوندەکان، و کاری کشتوکاڵ ڕووی لە خراپی کرد و خۆراك ڕووی لە کەمی کردبوو. ١٠/٤ ژنەکان کە ڕیزیان بەستبوو بۆ بەدەستهێنانی نان، دەستیان کرد بە شۆڕش. کرێکارەکانیش چوونە ناو ئەم شۆڕشەوە و ڕۆژی دواتر ڕێبەرانی ڕادیکاڵەکان ڕێپێوانێکی ڕەخنەگرانەیان کە پانزدە میلی خایاند ڕێبەرایەتی کرد بەرەو ڤێرسای.

تاوەکو دوانیوەڕۆی ١٠/٤ ئاپۆرەی خۆپیشاندەران هەشت هەزار نەفەری لە خۆگرت و چواردەوری کۆشکی پاشایان دا و نانیان دەویست. لافایت بە گاردی نەتەویەوە گەیشتە ڤێرسای بۆ ئەوەی نەزم بەرقراربکات بەڵام بەیانی ڕۆژی دواتر، کاتێك کە

ئاپۆرەی خۆپیشاندەران داوایان لە پاشا و شاژن کرد بەرەو پاریس بڕۆن، لافایت ئامۆژکاری پاشای کرد کە بڕوات بۆ ئەوەی ڕێگە لە ڕشتنی خوێن بگرێت. لوئی ڕەزامەندی دەربڕی و دەمەوئێوارە لە پاریس جێگیر بوو.

چەند ڕۆژ دواتر پەرلەمانیش گوازرایەوە بۆ پاریس. بەم پێیە هەم پادشا و هەم پەرلەمان کە تاکە دامەزراوە بوون کە توانای یاسا دەرکردنیان هەبوو هەردووکیان کەوتنە بەردەستی کۆمەڵانی خەڵك و بەم پێیەش لە ناو دەستی ژاکوبنەکاندا بوون. هەندێك لە نەجیبزادەکانی ناو حکومەت هەستیان بە مەسەلەکە کرد و هەر زوو فەڕانسەیان جێهێشت بەرەو پاریزگاکانی سەر سنووری ئاڵمان، بە ئومێدی ئەوەی کە لەوێدا لەشکرێك کۆبکەنەوە ئاوی ڕژاوی حکومەتی کۆن بگەڕێننەوە ناو جۆگە.

بەڵام ڕادیکاڵەکان هەر زوو هەوڵیان دا هەوساری شۆڕش بگرنە دەست. یانەی ژاکوبن نامەی نارد بۆ هەموو یانە سیاسیەکانی دیکەی فەڕانسە کە سیاسەتی ناوچەکە بگرنە ژێردەستی خۆیان. لە هەموو شوێنێك میانڕەوەکانیان وەلانا. ڕادیکاڵەکان کە ئاژاوەخوڵقێن و قسە لەڕوو و شارەزاش بوون لە خەڵك خستنە ژێر ڕکێفی خۆیان، کەم کەم هاتنە مەیدان.

هەرلەو کاتەدا هەندێك کەس سازی دژ بە شۆڕشیان لێدەدا. زۆرێك لە خەڵکی ئاسایی گەرچی دەرکیان بەوە کردبوو کارەکانی کەلیسا هەڵەبوون بەڵام ئەو کارانەش کە دژ بەوان کرا بە زیادەڕەویان دەزانی.

لوئی پاشای فەرانسەش هەستی بەوکرد کە ئەو کارانەی دەکرێ زۆر توندڕەوانەیە. ئەو دڵنیا بوو لەوەی کە هەوڵدان بۆ ڕێکەوتن لە گەڵ پەرلەمان بێسوودە و مەحاڵە. ئەویش دەبوایە بچێتە ڕیزی ئەو کسانەوە کە وڵاتیان جێهێشتبوو. لە ڕۆژی ٧/٣٠ ساڵی ١٧٩١ پاشا و شاژن، لە جلوبەرگی خزمەکارەکاندا بە گالیسکەیەك پاریسیان جێهێشت. بەڵام لە نزیك سنوورەکان دەستگیرکران و گەڕێندرانەوە بۆ پاریس. هەوڵی ئەوان بۆ هەڵاتن مۆری بێ متمانەییان لێدا، چونکە پادشا نیشانی دا کە چی تر جێگای متمانە نییە.



ڕۆبسپیری پارێزەر: سەردەمی ترس وتۆقاندن.



کوشت وکوشتار لە کۆشکی پاشایەتی لە توئیلیر

## ناکۆکی لەسەر دەسەڵات و مانەوە

لە مانگی ١٠ی ١٧٩١ دەستوری نوێ گەیشتبووە ئاستی جێ بەجێکردنەوە. دەستەی یاسادانان هەر زۆر زوو خواستی ئەوەی هەبوو ئەو دەستوورە ڕەد بکاتەوە و کۆمارێکی نوێ بونیاد بنێت. دوو گروپ بۆ چوونە دەسەڵاتەوە کەوتنە دژایەتی یەکتر. یەکەمیان ژیروەندەکان کە نوێنەرانی چینی سێهەم بوون. ئەمانە ژمارەیان زۆر زیاتر بوو لە دەستەی دووەم، واتە ژاکوبنەکان، کە خەڵکە بێلانەکانی پاریس پشتوانیان بوون. بابەتی سەرەکی گفتوگۆی نێوان ئەم دوو گروپە ئەوە بوو کە ئایا جەنگ لە دژی نەمسا ڕابگەیەنن یان نا. ژیروەندەکان باوەڕیان وابوو کە لەوانەیە جەنگێك بتوانێ ئەم شۆڕشە بەرفراوان بکات بۆ هەموو ئەوروپا. ژاکوبنەکان دژی ئەوە بوون چونکە دەترسان کە نەکا جەنگ دەسەڵات لە چنگی فەڕانسیەکان دەربێنێت. بەهانەی ئەو جەنگەش ئەوەبوو کە ئیمپراتۆری نەمسا، واتە لیئۆپۆلدی دووەم برای ماری ئانتوانت، نەخشەی کێشابوو کە شۆڕشەکە دامرکێنێتەوە. ئەو لە ڕاستیدا خوازیاری جەنگ نەبوو.

دەستەی یاسادانان لە مانگی چواری ١٧٩٢ جەنگی لە دژی نەمسا و پرۆسیا ڕاگەیاند. فەڕانسە ئەو کاتە وڵاتێکی لاواز بوو، و حکومەتەکەشی یەکگرتوو نەبوو، لە ڕووی داهاتیشەوە بارودۆخی خراپ بوو و فەرماندە سەربازیەکان خەریکبوون بە سوودی دوژمن دەجەنگان. هێزی دوژمن بەبێ هیچ ڕێگرییەك لە پایتەخت نزیك دەبوونەوە، پاریس دوچاری شڵەژان و ئاڵۆزی بوویەوە و ژاکوبنەکان ئەم هەلەیان قۆستەوە.



به پێی فەرمانی كۆنفێنشنی نەتەوەیی لە ١٧٩٣/١٠/٥ ڕۆژمێری نوێی كۆمارییەكان دەستی پێكرد كە لە ١٢ مانگی سی ڕۆژە پێكهاتووە. ئەم ڕۆژمێرەش ناپلیۆن لە مانگی یەكی ساڵی ١٨٠٦ ڕەفزی كردەوە.

لەم نێوانەدا سێ ڕابەر پەیدا بوو: مارا كە كۆمارییەكی توندڕەو بوو، دانتۆن كە دێوێك بوو بۆ خۆی بە ووتە توند وتیژەكانی دەیتوانی خەڵكی هانبدات و سێهەمیش ڕۆبسپیری ئارام كە پارێزەر بوو كە باوەڕی وابوو كە شۆڕش دەبێ لە كۆمەڵگای فەڕانسە گۆڕانكاری ڕیشەی بكات. دانتۆن و مارا بە وتارە وروژێنەراكانیان زیاتر لە پێشتر خەڵكیان هاندا بۆ دژایەتیكردنی سیستەمی پاشایەتی. ئەوان ڕێبەرایەتی خۆپیشاندانەكانیان دەكرد و دەستیان كرد بە كوشت وكوشتار شەش سەد سوسیسرایی گاردی نەتەوی كوژران، و زۆری دیكە كەوتنە زیندانەكانەوە و نەجیبزادەو ڕوحانیەكانیان هێنایە دەرێ و لە دادگای خەڵك لە سەرجادە دادگایان كردن. هەتا ئەوانەشی كە لێخۆشبوونیان بۆدەرچووبوو كەوتنە بەردەستی خەڵك كە لە لێواری مەرگدا بوون. حكومەت هیچ هەنگاوێكی بۆ ڕێگریكردن لەم شۆڕشە نەنا.

ئەم بارودۆخە كەمێ ئارام بۆیەوە كاتێ هەواڵ گەیشت كە هێزی سەربازی فەڕانسە توانیویەتی پاشەكشە بە هێزی دوژمن بكات، هەر لە هەمان ڕۆژ پەرلەمانێكی نوێ بونیادنرا و دەنگ بە كۆماریی درا. ئەوان بۆ ئەوەی سەرەتای حكومەتی كۆماریی دەستنیشان بكەن ڕۆژمێری پێشویان هەڵوەشاندوە. ساڵی یەكەمی كۆماری فەڕانسە دەستی پێكردبوو.

## شۆڕشی كۆماری

كاتێك فەڕانسە بووە حكومەتێكی كۆماریی، ئەوەی مابوویەوە ئەوەبوو كە چی لە گەڵ پادشا بكەن. زۆرێك پێیان باش بوو كە ئازادی بكەن و بڕوات لە دەرەوەی فەڕانسە ژیان بەسەربەرێت. ژاكوبنەكان لەوە دەترسان كە خەڵك دواتر بیانهەوێ بیگەڕێننەوە،

ژاكوبنەكان كە جڵەوەی زۆری خەڵكیان لە دەستدابوو توانیان پەرلەمان ناچاربكەن بڕیار لەسەر مەرگی پادشا دەربكات.

لوئی شانزەهەم لە ١٧٩٣/٦/٢١ بە هۆی گیوتینەوە لە سێدارەدرا. كوشتنی پادشا كە بە ناوی خەڵكەوە كرابوو سەرانسەری جیهانی لەرزاند. لیبڕاڵەكانی ئینگلیز و ئەمریكا كە لە سەرەتادا ستایشی شۆڕشیان دەكرد، بەتەواوی شڵەژابوون. چیتر شۆڕشی فەڕانسە تێكۆشان نەبوو بۆ بەدەستهێنانی مافەكانی خەڵك، بەڵكو بە ڕق و توندوتیژی خەڵك لە قەڵەم دەدرا هەموو شتێكی چاك و بە نەزم لەناودەبردرا. ئینگلیزیش هاتە ڕیزی پشتیوانی نەمسا و پرۆسیا بۆ جەنگی دژ بە فەڕانسە.

لەناوخۆی فەڕانسە كاردانەوەی توند سەریهەڵدا. خەڵكانێك كە وەفاداری پادشا و كەلیسا بوون بە ئاشكرا هەڵسانەوە دەستیانكرد بە دژایەتیكردن. ئەنجامی ئەو قەیرانەش ئەوبوو كە ژاكوبنەكان لە ڕێگای یەك كۆمیتەی ئاسایشی گشتی بەتەواوی حكومەتیان گرتە دەست. پەرلەمان ویستی دژایەتی ئەم كارە بكات بەڵام پشتیوانانی ژاكوبنەكان خەڵكی ناو پەرلەمانیان ئابڵۆقەدا و ٢٩ كەسیان هێنایە ژێر تیغی گیوتینەوە.

كۆمیتە كە لە ساڵی یەكەمی دەسەڵاتی بوو، هێشتا بە سەردەمی ترس وتۆقێنەر بەناوبانگ بوو. كۆمیتە دەستیكرد بە لەناوبردنی هەركەسێك دژایەتیان بكات. دەوترێ لەم نێوانەدا ٤٠هەزار كەس كوژرابن. ڕۆبسپیری پارێزەر بووە ڕابەری ئەم ڕووداوانە و زۆرێك لە دۆستەكانی خۆشی لەناوبردن هەتا دانتۆنیش.

هەر لەهەمان كاتدا كۆمیتە خەڵكی ئامادە و ڕێكدەخست بۆ جەنگ دژ بە دوژمنە دەرەكیەكان، فەرمانی بە لاوەكان دا بێنە ناو هێزی سەربازییەوە و ئەم كارەش لە مێژووی فەڕانسە شتێكی نوێ بوو. ئیتر سەربازەكان نەدەبوایە وەك سەربازەكانی پادشا بە زۆر خزمەتی سەربازی بكەن، بەڵكو وەكو كەسێكی فەڕانسەی كە دەجەنگن لە پێناو نیشتمان و خاك و خەڵكەكەی و بۆ ئامانجەكانی شۆڕش. بە درێژایی ساڵی ١٧٩٣ تا ١٧٩٤ شەوقی هێزی سەربازی شۆڕشی كۆماری وای لێكردن لە زۆرێك لە جەنگەكان سەركەوتن بەدەست بهێنن. دەسكەوتنەكانی هێزی سەربازی، ڕۆبسپیری پارێزەری خستە مەترسیەوە. لەگەڵ نەمانی ترس لە دوژمن، هاندانی خەڵكیش دامركایەوە. زۆرێك لە نەیارەكانی ڕۆبسپیر دەستیانكرد بە دژایەتیكردنی. لە ٧/٢٦ ڕۆبسپیر تاونباركراو ڕۆژی دواتر لە گیوتین درا، و سەردەمی ترس و تۆقاندان كۆتایی پێهات.



ترس و تۆقاندن: كاریكاتۆرێك بە ناوی (حكومەتی ڕۆبسپێر) كە ژمارەیەكی زۆر سری بڕدراوی لێیە. نیشانی دەدات كە ئەوانەی مردوون زۆربەیان دەسلاتدار و دەوڵەمەندەكانن.


جۆرێك لە گیوتین

## کۆتایی شۆڕش

لە هاوینی ساڵی ١٧٩٤ خەڵك کەم کەم ئارام بوونەوە. یانەکانی ژاکوبن داخران. زیندانیە سیاسیەکان ئازادکران. ڕوحانیەکان کاری پەرستش وعیبادەتی خۆیان بە بێ دەردەسەر دەستپێکردەوە. حکومەت کەوتە دەستی دەستەی بەڕێوەبردن، ئەمانە گروپێك بوون کە نەدەبوایە گوێ بە قسەی خەڵك بدەن. لەوکاتەدا فەڕانسە زۆر بە ئارامی هەناسەی دەکێشا. قۆناغی دواتر سەروکەلەی ناپلیۆن پەیدا بوو.

## دەرئەنجامەکانی شۆڕشی فەڕانسە

سەدەی نۆزدەیەم سێ "ئیسم" دەرکەوتن و سەرکەوتیشن: سۆسیالیسم( یا کۆمەڵگەرایی)، لیبرالیسم( ئازادی بیرکردنەوە وخوازیاری ئازادی) و ناسیۆنالیسم( یا نەتەوەگەرایی). شۆڕشی فەڕانسە ئەنگیزەی هەرسێکیان بوو. نوێنەری بەشی سۆسیالیست لە شۆڕشی فەڕانسە پیاوێك بوو بە ناوی بابوف کە پێی وابوو هەموو ئەوەی تاکو ئێستا لە فەڕانسە ڕوویداوە شتێك نییە" جگە لە ڕێخۆشکەر بۆ شۆڕشێکی دیکە کە زۆر گەورەتر و زۆر کاریگەرتر دەبێت لەو شۆڕشەی ئەخیر. لەو شۆڕشە نوێیەدا هەموو خاوەنداریەك دەکەوێتە ژێردەستی حکومەت، هەموان کاردەکەن و سامانیش بە شێوەی یەکسان بەسەرهەموان دابەش دەکرێت. ئەم ئەندیشانە لە ڕۆژگاری بابۆفدا زۆر توندڕەوانەبوون.

نوێنەری بەشی لیبراڵ لە شۆڕشی فەڕانسە بورژوازی بوو، واتە گروپێك بوون کە خاوەن ماڵ و مناڵ بوون، بازرگان و کاسبکاربوون. ئەوان ئینگلتەراو ئەمریکایان وەکو دوو نموونەی چاکی حکومەت دەزانی. لە ڕوانگەی ئەوانەوە مافی خەڵکی مەدەنی و دەوڵەتی پابەند بە یاسا، گرینگترینی شتەکان بوون.




دەسەڵاتخوازانی فەڕانسە

هەڵسانەوەی ناوخۆیی(ژیروندەکان)

١ نەمسا، پرۆس ١٧٩٢

٢ و ٣ نەمسا، پرۆس ١٧٩٣

٤ ئینگلتەرا ١٧٩٣

دژ بە هێزی کەلیسا بوون و خوازیاری دادپەروەری ماڤی زیاتر بوون بۆ هەمووان، بەڵام پێیانخۆش نەبوو سامانەکانیان لێبستێننەوە. ئەوان هەر لە سەرەتاکانی شۆڕشەوە بە زۆرێك لە خواستەکانیان گەیشتن. جاڕنامەی ماڤی مرۆڤ و هاوڵاتی بوون وەسفی ئامانجەکانی لیبراڵیسمی کردبوو.

بەڵام گرنگترین پێکهاتەی شۆڕش ناسیونالیسم بوو، چونکە ناسیونالیسم ئەو ڕێگایەی گۆڕی کە حکومەت بۆ بەڕێوەبردن لە نێوان پارێزگاکان گرتبوویە بەر، و هەم پەیوەندیەکانی نێوان پارێزگاکانی ئاوەژووکردەوە، ئەویش بەو مانایە بوو کە وای لەو خەڵکانە دەکرد کە یەك ملیەتیان هەیە کارەکانی تایبەت بە خۆیان خۆیان بیکەن و پارێزگاکانی دیکە

حکومەتیان بەسەرەوە نەکەن. بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم هەستی ناسیونالیستی، هەڕەشە بوو بۆ سەر ئیمپراتۆریەتەکانی نەمسا، ڕوسیە و عوسمانی کە لەم ئیمپراتۆریەتانە نەتەوەی جۆراوجۆر دەژیان، کە سەرئەنجام کار گەیشتە ئەوەی دوو هێزی نوێ بەرپا بوون لە ئەوروپا ئەوانیش ئەڵمانێکی یەکگرتوو و ئیتالیایەکی یەکگرتوو.

هاندەری ڕاستەوخۆی ناسیونالیسم، شۆڕشی فەڕانسە بوو. یەك هێزی سەربازی نەتەوی بۆ ڕوبەڕوبونەوەی هێزی سەربازی پاشاکانی ئەوروپا دروستکرا. حکومەتی شۆڕشگێڕی وای لە خەڵکی هەموو ناوچەکان کرد بە بە زاراوەی جیاواز قسەیان دەکرد واداری کردن کە بەزمانی فەڕانسەوی قسە بکەن, قوتابخانەکانی وادارکرد کە زمان و مێژووی فەڕانسە بخوێنن. ئالایەکی نەتەوی سێ ڕەنگ، سرودی نەتەوەیی" مارسێز" و پشویەکی نەتەوەی (ڕۆژی کەوتنی باستیل) وای کرد کە خەڵکی فەڕانسە وەك نەتەوەیەکی یەکگرتوو لە دەوری یەك خڕبنەوە.

هەموو ئەمانە هاوکار بوون بۆ خەڵکی فەڕانسە کە باوەڕ بکەن کە فەڕانسەویی بوونی ئەوان لە پێش هەموو شتێکەوەیە. هەروەکوو یەکێك لە گەنجەکانی ناو ژاکوبنەکان لە ساڵی ١٧٩٣ نامەی بۆ دایکی دەنوسێ" ژیان و توانایی ئێمە پەیوەست نییە بە خۆمانەوە، بەڵکو هەموو شتێکمان بۆ نەتەوەیە". سوسیالیسم، ناسیونالیسم و لیبرالیسم هەر سێکیان بەرهەمی شۆڕشی فەڕانسەن. ئەم شۆڕشە لەوانەیە گەورەترینی شۆڕشەکان بێت، و ئەو ئەندێشەیەی لە

بیری خەڵکدا ڕواند کە دەتوانرێ کۆمەڵگا بە هێزو ئیرادە لە بنەڕەتدا بونیادبنرێتەوە. ڕێبەرێکی چریکی یۆنانی کە لە ساڵی ١٨٢١ بۆ ئازادی یۆنان دژی عوسمانیەکان دەجەنگا بۆ سەربەخۆی یونان، دەیگووت: (بەڕای من شۆڕشی فەڕانسە ..چاوی خەڵکی جیهانی کردەوە. بەرلەمە نەتەوەکان هیچیان نەدەزانی، و خەڵك وایاندەزانی پادشاکان خوداوەندانی سەر ڕووی زەوین و دەبوایە هەرچی ئەوان دەیڵێن گوێڕایەڵیان بکرێت. بەهۆی ئەم ئاوەژووبوونەوەی سیستەمی حوکمڕانی ئیتر حکومەتکردن بەسەر خەڵکەوە کارێکی ئاسان نییە).




سنووری فەڕانسە لە ڕوانگەی (گوتە). شاعیری ئەڵمانی، لە ساڵی ١٧٩٠. تێپەڕن! ئەم سەرزەویە ئازادە!




لاپەڕەیەك لە سروودی نیشتمانی فەڕانسە

لەهەركوێیەك كە شۆڕشگێڕان هەبوایەن ناسیۆنالیستیش هەبوو، هەروەكو لە یۆنان ساڵی ١٨٢١، یان لیبڕال بوون، هەروەكوو لە ئاڵمتن ١٨٤٨و یان سوسیالیست بوون، هەر وەكوو لە فەڕانسە ١٨٧١. بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم شۆڕشگێڕان ڕێگاو ڕەوشی خۆیان، ئامانج و دروشمەكانی خۆیان لە شۆڕشی گەورەی فەڕانسە (واتە ساڵانی ١٧٨٩ تا ١٧٩٩) دەدۆزیەوە. گەورەترین میراتی شۆڕشی فەڕانسە ئەو ئەندیشەیە بوو كە مرۆڤەكان دەتوانن جیهانی خۆیان دروست بكەن، نەك تەنها لە ڕوانگەی مادیی ئامراز و ئامێرەكان، بەڵكو لە ڕوانگەی سیاسی، ئەخلاقی، مەعنەوی، سیمبول، ووتە و یاساكان.